وتاری حەڤدە

زنجیرە وتاری (شیرك و شیركی گوێڕایەڵی كردن)

# الشرك وشرك الطاعة

## الديمقراطية و الشورى

## دیموكراسی و شورا

شێخی موجاهید

تقبله الله

أبو علي الأنباري

وەرگێڕان و ئامادەكردنی

پێگەی ڕاستەڕێ




پێگەی ڕاستەڕێ

بسم الله الرحمن الرحيم

وتاری

شێخ ئەبی عەلی ئەنباری - تقبه الله-

وتاری (حەڤدە)

بەناونیشانی

ديموكراسی و شورا

وەرگێڕانی

پێگەی ڕاستەڕێ



الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله

خوایە حەقمان بە حەق پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر شوێنکەوتنی، وە باتڵیشمان بە باتڵ پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر ئەوەی لێی دووربکەوینەوە، خوایە ئەوەمان فێر بکە کە سوودمان پێدەگەیەنێت و سوودمەندمان بکە بەوەی فێرمان دەکەیت، پەروەردگارا لەوانەمان بکەیت کە کار بە زانستەکەیان دەکەن، خوایە زانستەکەمان بکە بە بەڵگە و حوججە بۆمان ئەو ڕۆژەی بە دیدارت دەگەین و نەیکەیتە بەڵگە بەسەرمانەوە ئەی چاکترینی بە بەزەییان، ئەی پەروەردگارم سینەم ئاسوودە و گوشاد بکە و کاروبار و هەوڵ وکۆششم بۆ ئاسان بکە و گرێی زمانم بکەرەوە و زمانم گۆیا و پاراو بکە تا لە گوفتارم تێبگەن، پەروەردگارا کردەوەکانم چاك بکە و تەنها بۆ ڕەزامەندی تۆ بێت و هیچ بەشێکی تێدا نەبێت بۆ هیچ یەکێك لە دروستکراوانت، لە پاشاندا:

لە فەزڵ و بەخششی الله تعالی تەواوبووین لە باسی پێناسەی دیموکراسی، پاشان دوای ئەمە لە باسی کۆڵەکەکانی دیموکراسی: ئازادی بیروباوەڕ، و ڕادەربڕین و تاکەکەسی، پاشان بنەمای یەکسانی، وە بەدڵنیاییەوە ئەوەی پێی گەیشتین لە ڕێگەی ئەو بەڵگانەی باسمان کرد ئەوە بوو کە هیچ ئیسلامێك بوونی نیە لە دیموکراسی و هیچ دیموکراسیێکیش بوونی نیە لە ئیسلام، هەردووکیان دوو دینی جیاوازن، ئەمە ئەفلاتونی و ئەوەی تر خوایی، ئەمڕۆش باسی لایەنێکی تر لە بابەتەکانی پەیوەست بە دیموکراسی دەکەین، دەستەواژەیەك هەیە بڵاوە لەسەر زوبانەکان و بە گوێچکەکان دا دەدرێت، هەمیشە دەبیستی کە "ئیسلام دینێکی دیموکراسییە"، جا لە دیدارەکان بێت یان لە وانەکان بێت یان لە وتارەکان بێت یان لە پەڕتوکەکان بێت، هەمیشە دەبینی ئەم دەستەواژەیە بە گوێچکەکاندا دەدرێت، وە ئەوەی سەرۆك و گەورەی بڵاوکردنەوەی ئەم دەستەواژەیەیە بریتیین لە ئیخوانی میصر و کلکەکانیان لە هەر شوێنێك بن، جا ئەوان خاوەنی وتەکەن: ئیسلام دینێکی دیموکراسییە، چۆن ئەوانە دەوێرن ئیسلام وەسف بکەن بەوەی دینێکی دیموکراسییە؟!، ئایا ئەو شتە چییە پشتی پێدەبەستن لە شەرع لەسەر ئەوەی پێیان وایە ئیسلام دینێکی دیموکراسییە؟ ئەو دەروازەیەی دۆزیویانەتەوە لە ئیسلام -سەرەڕای جیاوازی- بۆ ئەوەی بڵێن دیموکراسی ئیسلامە، بریتییە لەوەی لە شەرعی ئێمە ناسراوە بە شورا، جا کاتێك شورایان بەکارهێنا وەك ناوێك وتیان: مادام ئێمە شورامان هەیە، دیموکراسییش بە هەمان شێوە دامەزراوە لەسەر هەڵبژاردنی کەسەکان و لەسەر وەرگرتنی بۆچوونەکان، بۆیە ئەو شتەی هەیە لە دیموکراسی هەمان شتە لە ئیسلامدا هەیە بەناوی شورا، ناوی ئیسلام نانێن بە دینی شورا بەڵکو هەمیشە سوورن لەسەر ئەوەی ئیسلام دینێکی دیموکراسییە، وە ئەوەشی هانیدان بۆ ئەم کارە -واتە چۆن وێران ئیسلام وا دابنێن کە شوێنکەوتەی ئەفلاتونە- چۆن؟ چونکە ویستیان هەندێك بابەت بهێننە دی، لە پێشەکی ئەم بابەتانەش

ئەوەیە ڕۆژئاوا لێیان ڕازی بن، نازانم لەوانەیت کە شتێك لە پەڕتوکەکانی بیرمەندەکانی ئیخوان و کلکەکانیانت خوێندبێتەوە، هەمیشە پێداگرن لەسەر بەڵگە هێنانەوە لەسەر ڕاستی و دروستی ئیسلام بە وتەکانی فڵانە زانای ئەمریکی و فڵانی بەریتانی و فڵانی فەڕەنسی، لە کاتێکدا الله تعالی بە ئیسلام ڕازی بووە بۆمان و هەڵیبژاردووە بۆمان، ئیتر وتەی ئەو نەسرانییە و ئەو جوولەکەیە و ئەمە و ئەمە.. دەکاتە چی لەلام، هەمیشە تامەزرۆی ئەم بابەتانەن، وە هەوڵدەدەن گەورەیی ئیسلام بسەلمێنن لە ڕێگەی ئەوانە، وە هەمیشە سوورن لەسەر ڕازیکردنی ڕۆژئاوا، وە ڕۆژئاوا دەیانەوێت دیموکراسی هەبێت، بۆیە کێشەیان نیە بڵێن: ئیسلام دینێکی دیموکراسییە.

وە ئەوانە هەروەك دەزانن هەمیشە گۆچانەکە لە ناوەڕاستەوە دەگرن، جا ڕۆژئاوا ڕازی دەکەن ئەوانەی بانگەواز دەکەن بۆ دیموکراسی و بە هەمان شێوە دەیانەوێت موسڵمانان هەڵخەڵەتێنن بۆیە وتیان ئیسلام دینێکی دیموکراسییە، وە هەروەها موسڵمانانیش هێمن بوون و وەستان بۆ ئەم دەستەواژەیە یاخود قبوڵیان کرد جا بە ڕازی بوون بێت یان بە باوەڕبوون بێت، بەڵام ئیتر بڵاوبووەوە لە نێو خەڵکدا کە ئیسلام دێنێکی دیموکراسییە، جا ئایا لە کوێ ئیسلام بە دیموکراسی دەگاتەوە لە بابەتی شورا؟

لە دوو جێگەدا بانگخوازانی ئەفلاتون دۆزیویەتیانەوە، کە مەبەستم ئیخوانی میصر و کلکەکانیان و ئەوانەشی چوونەتە پاڵیان لە مورجیئە و لە بانگخوازانی دیموکراسی، ڕووی لێکچوونیان لە دوو خاڵدا دۆزیوەتەوە -کە وا گومانیان بردووە- سەرەڕای جیاواز بوون لە جێبەجێکردندا، جا وتیان: ئیسلام دینێکی دیموکراسییە، ئەم دوو بابەتەش، یەکەمیان لە هەڵبژاردنی دەسەڵاتداران، جا کاتێك بینیان لە وڵاتانی دیموکراسی و لە سیستەمی دیموکراسی خەڵك کاربەدەستەکانیان هەڵدەبژێرن وتیان: ئەمە بە هەمان شێوە لە شورا هەیە و موسڵمانان کاربەدەستەکانیان هەڵدەبژێرن، لێرەوە وتیان ئیسلام دینێکی دیموکراسییە، ئەمە جێگەی یەکەم کە وا گومانیان برد ئەوان ڕووی لێکچوونیان دۆزیوەتەوە لە نێوان ئیسلام و دیموکراسی.

سەبارەت بە جێگەی دووەم جا لە کاری پەرلەمان کە ئەوانەش پێیان دەڵێین پەرلەمان لە ڕووی ناسراویەوە ئەگینا ڕاستەکە ئەوەیە لە ڕووی دینەوە پێیان بڵێین ئەنجومەنی تەشریعی هەروەك خۆیان ئەم ناوە بەکاردێنن﴿أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ﴾[1] ، واتە: (ئایا ئەو بێباوەڕانە ڕازین بە بەرنامەی الله) یاخود شوێنی ئەو هاوەڵگەرانە دەکەون کە بەناوی دینەوە بەرنامەیان بۆ داناون و پەیڕەوییان دەکەن بێ ئەوەی الله مۆڵەتی دابێت و پێی ڕازی بێت. جا ئەوان ئەنجومەنی تەشریعیین،

(١)الشورى: ٢١.

کاتێك شوێنکەوتووانی ئەفلاتون لەوانەی دراونەتە پاڵ ئیسلام سەیریان کرد کە لە پەرلەمان هیچ کارێك ناکەن تەنها دوای ئەوە نەبێ ڕاوێژ دەکەن بە دانیشتووەکان، وتیان کەوایە ئەم دیموکراسییە هەیە لە لای ئێمە لە ئیسلامدا، بە هەمان شێوە دەسەڵاتداران لە ئیسلامدا ڕاوێژ دەکەن پێش ئەوەی کارێك بکەن و لێرەش لە پەرلەمان ڕاوێژ دەکەن لە ئەنجومەنە تەشریعییەکان پێش ئەوەی کارێك بکەن، لەم دوو جێگەیەدا وا گومانیان برد کە ئیسلام شتێکی لە دیموکراسی تیادایە، ئینجا ئایا ئەوەی ئەوانە بۆی چوونە شتێك لە ڕاستی و دروستی تێدایە؟

نەخێر، جیاکەرەوە لە نێوان ئیسلام و دیموکراسی لە هەڵبژاردنی دەسەڵاتداران، جیاوازە لە دوو لایەنەوە: لایەنی یەکەم کێ هەڵدەبـژێـرێـت، لایەنی دووەم کێ هەڵدەبـژێـردرێـت، جا جیاوازی لە لایەنی یەکەم کێ دەسەڵاتداران هەڵدەبژێرێت، جیاکەرەوەیەك هەیە لە نێوان ئیسلام و دیموکراسیدا، جیاوازییەکەی تر لە هەڵبژاردنی دەسەڵاتداران ئەوەیە کێ هەڵدەبژێرین و لە دیموکراسیشدا کێ هەڵدەبژێرن، جا ئەگەر ئەم بابەتەت زانی ئەوا بزانە هیچ پەیوەندییێك نیە لە هەڵبژاردنی دەسەڵاتداران لە نێوان شورای ئیسلام و دیموکراسی ئەفلاتون و دیموکراسی ئیخوانی میصر.

لە بابەتی ئەوەی کێ دەسەڵاتداران هەڵدەبژێرێت لە ئیسلامدا، هەروەك پێشتر باسمان کرد کە بەڕێوەبردنی کاروبار بە موسڵمان دەسپێردرێت یان بە دەقێك لە خەلیفەی پێش خۆی، خەلیفەیەکمان هەیە نووسیویەتی کە فڵان دەبێتە خەلیفە لە دوای ئەو، کارەکە کۆتایی هات ئیتر ئەمە دەبێتە خەلیفە بە دەقی پێش خۆی، ئایا ڕاوێژ دەکات، ئایا ئەو دەزانێت شایستەیە بۆ ئەم کارە؟ جا بابەتەکە دەگەڕێتەوە لای ئەو، هەر بۆیەش کاتێك پرسیارکرا لە (الصدیق ﷺ) چۆن فاروقت هەڵبژارد لە کاتێکدا خەڵکی توندیەکەیان بینیوە، وتی "پێیان دەڵێم چاکترینیانم بۆ هەڵبژاردوون" یاخود هەروەك (الصدیق ﷺ) وتی، ئەمە ڕێگای یەکەم لە هەڵبژاردنی دەسەڵاتداران لە دینەکەمان.

سەبارەت بە ڕێگەی دووەم، ئەوا ئەهلی حەل و عەقد و ئەهلی شورا ڕاوێژ دەکەن لە هەڵبژاردنی ئەو کەسەی کاروباری موسڵمانان دەگرێتە دەست، ئەمەش لە کاری ئیمامی عومەر ﷺبوو کاتێك بابەتەکەی کردە شورا لە نێوان شەش لە صەحابە و بابەتەکەی دایە دەست کوڕەکەی (عبد الله بن عمر) بەهۆی ئەوەی ئەو هیچ شتێکی بۆ نەبوو لە ئەرکەکە، لەگەڵ ئەوان بوو بەڵام نەخرایە ناویان، پاشان بۆچوونی ئەوانە جێگیربوو، شورا و ڕاوێژیان بە هەندێك لە موسڵمانان کرد لە مەدینە، جا بۆچوونەکەیان جێگیربوو لەسەر ئەوەی ئیمامی عثمان ﷺپێش بخەن بۆیە پێشیانخست و بەیعەتیان پێدا لەسەر ئەم بنەمایە، ئەمە لە دینەکەمان.

هۆكاری سێیەم -وەك حاڵی ئێستامان- حوكمە ئیسلامییەكان پەكخراون و تاغوتان حوكمی بەندەكان و وڵاتان دەكەن بە دەستور و قانونی شەیتانی، جا الله عز وجل هەندێك لە موسڵمانانی توانادار كرد بەوەی جیهاد بكەن لە پێناویدا تاوەكو ئەوەی الله عز وجل دەسەڵاتداری كردن لە زەویدا ئینجا خیلافەتێكیان ڕاگەیاند و ئەم خیلافەتەش بە زاڵبوونە بەهۆی شمشێر و هێزەوە، واتە: كەسانێك جیهادیان كرد، ئەوانەی جیهادیان كرد الله عز وجل دەسەڵاتداری كردن و ئینجا پێشەواكەی خۆیان هەڵبژارد بۆ ئەوەی ببێتە خەلیفە، وە لەسەر موسڵمانانیشە گوێڕایەڵی بكەن؛ چونكە دەسەڵاتەكەی گرتووەتە دەست بە زاڵبوون و هێز و شمشێر، ئەمە ڕووەكانی دانانی خەلیفە بوو لە ئیسلامدا.

كەوابوو ڕێگای هەڵبژاردن بەم شێوەیە بوو لە ئیسلام، بەڵام لە دیموكراسیدا: هەموو ئەوانەی لە عێراقن بەشدارن لە هەڵبژاردنی دەسەڵاتدار بەو مەرجەی دەبێت تەمەنەكەی هەژدە ساڵی تێپەڕاندبێت، هەر كەسێك بگاتە هەژدە ساڵ ئەوا مافی ئەوەی هەیە ئەو كەسەی حوكمی وڵات دەكات هەڵبژێرێت، لەژێر سایەی ئەم مەرجەش هەموو ئەوانەی هەن لە عێراق مافی دەنگدانیان هەیە بۆ هەڵبژاردنی دەسەڵاتدار، بەمەش نەسرانی و ئاشوری و كلدانی مافی ئەوەیان هەیە هەڵبژێرن كێ حوكمی موسڵمانان بكات لە عێراق -لە كاتێكدا كەمینەن- وە ئێزیدی مافی هەیە هەڵبژێرێت كێ حوكم بكات، وە شیوعی و عەلمانی و ڕافیضی هەموو ئەوانە مافیان هەیە ئەو كەسە هەڵبژێرن كە حوكمی وڵات دەكات، كەوایە ئەمە جیاوازییەكە لە نێوان دیموكراسی و ئیسلام لە هەڵبژاردانی دەسەڵاتداران، وە بانگخوازانی ئەفلاتون وا گومانیان بردووە ڕووی لێكچوون هەیە لە نێوان هەڵبژاردنی دەسەڵاتداران لە ئیسلام و هەڵبژاردنی دەسەڵاتداران لە دیموكراسی، هەر بۆیەش وتیان: ئیسلام دینێكی دیموكراسییە.

تۆ ئێستا دەبینیت كە ڕووی لێكچوون نیە لە ئیسلام لە نێوان ئیسلام و دیموكراسیدا لە هەڵبژاردنی دەسەڵاتداران، چۆن؟

لە دیموكراسیدا -وتمان- هەموویان مافیان هەیە بەو مەرجەی تەمەنیان گەیشتبێتە هەژدە ساڵ، بەڵام لە ئیسلامدا تەنها موسڵمانان ڕاوێژیان پێدەكرێت، ڕاوێژ بە كەس ناكرێت تەنها موسڵمان نەبێت، وە تۆ دەزانیت ئێستا لە خاكەكەمان خاكی ئیسلام، وە خاوەن پەیمانەكانمان لە لایە -نەسارا- ئەوان خاوەن پەیمانی موسڵمانانن، ئەوانە قسەیان بۆ نیە لە هەڵبژاردنی ئەوەی كێ حوكمی موسڵمانان دەكات، بۆچوونیان وەرناگیرێت و ڕاوێژیان پێناكرێت، وە مافی ئەوەشیان نیە دەنگ بدەن بۆ ئەو كەسەی حوكمی خاكی ئیسلام دەكات و ئەو كەسەی كاروبارەكان تیایدا بەڕێوە دەبات، هەرچەندە ئەوان لە چوارچێوەی خاكی ئیسلام دەژین، بۆیە ئەگەر ئەو كەسەی ئاشتیمان پێداوە لەسەر دینەكەی بمێنێتەوە بە مەرجەكانی ئیسلام و بە ڕێككەرەكانی ئیسلام ئەوا مافی ئەوەی نیە بەشداری بكات لە هەڵبژاردنی ئەو

کەسەی حوکمیان دەکات، کەوابوو کوا ڕووی لێکچوون لە نێوان ئیسلام و دیموکراسیدا لە هەڵبژاردنی دەسەڵاتداران؟!

سەبارەت بە هەڵبژاردنی دەسەڵاتداران لە ئیسلامدا، دەبرێتە لای ئەهلی حەل و عەقد کە ئەوانیش ئەهلی شوران، ئەهلی شورا بەو پێیەی ئەوان موسڵمانن و هەروەها خاوەن زانستیشیان تیادایە، وە تیایاندایە شایستەی ئەوەیە ئەم کارەی پێبسپێردرێت، وە لە نێو ئەوانەدا دەبینی یەکێکیان خۆی لەمە بەدوور دەگرێت و دەیداتە پاڵ هاوڕێکەی؛ چونکە ئەم فەرموودەیەی رسول الله ﷺدەزانن "إنا والله لا نولي هذا العمل أحداً سأله أو أحداً حرص عليه"[١] ، واتە: ئێمە والله ئەم کارە ناسپێرین بە کەسێك کە داوای بکات یاخود کەسێك کە سوور بێت لەسەری. بۆیە ئەگەر بینیان یەکێك لەنێویاندا داوای دەکات ئەوا پێی نادەن، وە ئەگەر پێیان بەخشی و بینیان سوور بوو لەسەری ئیتر دوای ئەمە هیچ شتێکی لە کارەکە ڕادەست ناکەن، کەوایە ئەوان کاتێك ئەوانە هەڵدەبژێرن، هەڵدەبژێرن بەگوێرەی ئەوەی هەڵیانگرتووە لەم ئەمانەتە کە ئەوانە پیاوێك هەڵدەبژێرن لەوەی ئەوانە هەڵیانبژاردووە ئەوا دەبێتە هۆی ڕازیبوونی موسڵمانانیش بە هەمان شێوە، هەر بۆیە کاتێك ئەبو بەکر رضي الله عنههەڵبژێدرا، عەلی رضي الله عنهوتی: "ڕازی بووین بۆ دونیامان لەو کەسەی کە پێغەمبەر ﷺپێی ڕازیبوو بۆ دینەکەمان"، ئەو لە ڕووی دینەوە نوێژی بۆ دەکردین کاتێك پێغەمبەر ﷺلە ژیاندا بوو، ئێستاش کاروباری دونیامان دەگرێتە دەست، بۆیە مادام ئەو پێی ڕازیبوو لە ڕووی دینەوە کەوایە ئێمەش پێی ڕازی دەبین لە ڕووی دونیاوە، جا ئەوانە کاتێك هەڵدەبژێردران بەم شێوەیە هەڵدەبژێردران، بەڵام ئایا بێینە لای موسڵمانان وەك تاك و بڵێین بۆچوونت چییە و هەڵبژاردن و هاوشێوەی ئەمە بکەین، نەخێر، کارەکە بەم شێوەیە نیە.

جا خاڵی یەکەم کە گومانیان بردووە ئیسلام لە دیموکراسی دەچێت وتمان هیچ لێکچوونێك نیە لەوەی کێ هەڵدەبژێرێت، ئێستاش دێینە سەر ئەوەی کێ هەڵدەبژێردرێت بۆ حوکم، لە شورای ئیسلام کەس ناتوانێت هەڵبژێرێت جگە لە موسڵمان و کەسیش هەڵنابژێردرێت جگە لە موسڵمان، واتە کەس حوکم ناگرێتە دەست تەنها موسڵمان نەبێت، ئەمە لە ئیسلام، تەنانەت ڕازی نابین لە دەسەڵاتداری موسڵمان پیاوێکی غەیری موسڵمان لە هاوڕازەکانی بێت لەوانەی لەو نزیکن، لە ڕووی شەرعییەوە دروست نیە کەسێکی جوولەکە یان نەسرانی لە نزیکەکانی بێت، هەرچەندە ئەوان لە خاکی ئیسلام دەژین و خاوەن پەیمانن و لەئەستۆی ئێمەن، بەڵام ئایا مافی ئەوەیان هەیە لە هاوڕاز و نزیکی خەلیفە بن، ئەمە دروست نیە لەبەر فەرموودەی الله تعالی ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمۡ لَا يَأۡلُونَكُمۡ خَبَالًا وَدُّواْ مَا

(١)(متفق عليه).

عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ ٱلْبَغْضَآءُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ وَمَا تُخْفِى صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١١٨﴾ ﴾[١]واتە:ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بە کەسانێکی تر جگە لە خۆتان متمانە مەکەن و نهێنی خۆتان لایان مەدرکێنن، چونکە ئەوان کۆڵنادەن لە دروستکردنی تەنگانەو گیروگرفت و ناخۆشی بۆتان، ئاواتیان ئەوەیە دووچاری ئازارو کێشە ببن، بەئاشکرا ڕق و کینە لە دەم و دویاندا دیارە، ئەوەی لە سینەیاندا شاردویانەتەوە زۆر گەورەترە لەوەی کە دەریدەخەن، بێگومان ئێمە نیشانەو بەڵگەمان بۆ دیاری کردوون (تا دۆست لە دوژمن جیابکەنەوە)، ئەگەر عەقڵ و ژیریتان بخەنەکار. ، ئەگەر ئێوە خاوەن عەقڵن ئەوا بۆت نیە هاوڕاز و نزیکت لە غەیری موسڵمانان بێت، ئەمە لە ئیسلامدا، لەگەڵم وەرە بۆ لای دیموکراسی تاکو سەیری ئەو تێکەڵە هەمەڕەنگە بکەیت کە ئێستا حوکمی عێراق دەکات.

ڕافیضەیان تیادایە کە ئەوانە هەڵگەڕاونەتەوە لە دینی الله عز وجل، نەساڕایان تیادایە کە ئەوانەش الله عز وجل تەکفیری کردوون بەم وتەیەی -تبارك وتعالى- ﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ﴾[٢]واتە: سوێند بێت بەخوا بێگومان ئەوانەش بێ باوەڕ بوون کە وتیان: خوا یەکێکە لە سێ دانە خوا. ، وە ئێزیدیان تیایە و ئەوانەش هەروەك دەزانن شەیتانپەرستن ئێمە شارەزایانین، و ئەوان خەڵکی وڵاتەکەمانن و دەزانین چی دەپەرستن، لەوانەیە ئەوەی لە وڵاتە نەژیابێت شتێك نەزانێت دەربارەی ئێزیدیەت، لەوانەیە بڵێت من نایانناسم، بەڵام ئێمە دەیانناسین کە ئەوان شەیتان دەپەرستن، ئەوانەش هەڵبژێردراون بۆ ئەوەی لە چوارچێوەی ئەو پێکهاتە حکومییە بن کە حوکمی عێراق دەکات، کەوابوو هیچ پەیوەندییەك نیە لە نێوان ئیسلام و دیموکراسی لە هەڵبژاردنی دەسەڵاتداران.

دێینە سەر بابەتێکی تر کە لە ڕێگەیەوە بانگخوازانی ئەفلاتون دەیانەوێت بیسەلمێنن ئیسلام دینێکی دیموکراسییە، خاڵی دووەم چییە؟ ئەویش بابەتی پەرلەمانە، وتیان هەروەك لە ئیسلامدا خەلیفە کارێك ناکات تەنها دوای ئەوە نەبێ ڕاوێژ دەکات لەگەڵ براکانی، هەروەها لە دیموکراسییش، دەبینی سەرۆکی پەرلەمان هیچ بابەتێك نابڕێنێتەوە تەنها دوای ئەوەی ڕاوێژ دەکات بەوانەی لەگەڵین، جا وا گومانیان برد لێرەدا ئیسلام لە دیموکراسی دەچێت، یاخود لێرەدا دیموکراسی لە ئیسلام دەچێت، جیاوازییەکە لە کوێیە؟ لە پەرلەمان ئەنجومەنی تەشریعی جۆرەها خەڵك دەبینی، وە ئەوەی سەر بە حیزبی عێراقییە سەلیم جبوری - کە ئەمە لە سەرانی حیزبی عێراقییە- وە کاتێك دادەنیشێت دەبینی لەسەر سەری

(١)آل عمران: ١١٨.

(٢)المائدة: ٧٣.

نووسراوه ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ﴾[1]، پاشان دەبینی ڕاوێژ دەکات بە ئافرەتە ئێزیدێکی سەرکۆت، ئەی گەمژە مەگەر ئەم ئێزیدییە لە ئیماندارانە؟! (وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ) لە نێوان کێ؟ لە نێوان موسڵمانان، نەك ئێزیدی و شیوعی و ڕافیضی و عەلمانی و نەسرانی و جوولەکە، هەموو ئەوانە ڕاوێژیان پێناکرێت، بەڵام لە پەرلەمان هەموو ئەوانە ڕاوێژیان پێدەکرێت، پاشان ئیخوانییێك دێت و -پەنا بە الله لێیان- دەڵێت (وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ) ئەم ئایەتە لە میصر دانراوە، لە تونس، لە سودان، لە هەموو ئەو وڵاتانەی حوکمی دەکەن دەبینی ئەم ئایەتە نووسراوە لەسەر سەریان، پاشانیش خۆیان ناپارێزن لە ڕاوێژکردن بە جوولەکەیەك یان نەسرانییێك یان شیوعییێك یان ئێزیدییێك، تەنانەت کارەکە گەیشتووەتە ئەوەی لە سودان کاتێك حوکمی دەکرا-پەنا بە الله- لە لایەن کلکەکانی ئیخوانی میصر، نەسرانییەکان توانیان چەند بەشێك لە خاکی موسڵمانان دابڕن، بەمەش بووە خاکی تایبەت بە خۆیان لە باشووری سودان لە سەردەمی ئەو بێنرخ و چەپەڵانە، هەروەها هەر لە سەردەمی ئەو چەپەڵانە کاتێك شێخ ئوسامە پاش ئەوەی کە ڕوویدا لە ئەفغانستان گەڕانەوە سودان و ئینجا خزمەتی زۆریان پێشکەش کردن، وتارێکی موحسین عبد الحميد هەیە -کەمێك لە بابەتەکە دەردەچین- ناوی ئەم وتارە -والله بە لەبەرکردنی ناوەکە ماندوو دەبی- "العقلية المقاصدية في الإسلام"، بیرم کەوتەوە، سەرنج بدە ئەو ئیخوانییانە پەنا بە الله بزانە حاڵیان چۆنە، لەم وتارەدا دەڵێت: ئوسامە و کۆمەڵێك لە حەماسییەکانی لەگەڵدا بوو هاتنە سودان، هەندێك بابەت و هەندێك شتی سوودبەخشیان پێشکەش کرد بەڵام ڕۆژئاوا هەستی پێکردن جا وتیان سودان ئیرهابییەکان لەخۆدەگرێت و ئەم جۆرە شتانە، وە دەڵێت لێرەوە عەقڵیەتی مەقاسیدی جوڵایەوە ئینجا تورابی ـیان -واتە حەسەن تورابی- نارده لای جا وتی: تۆ جیهادت کردووە لە پێناو الله و پاداشتیشت لە لای الله ـیە، بەڵام بوونی تۆ مەترسییە لەسەرمان و پێویستە وڵات جێبێڵیت لە ماوەی هەفتەیەکدا، ئەی نەفام تۆ نوێنەرێکی و ئەوانە موجاهیدن، تەنها ڕۆژئاوا هەستیان کردووە کە سودان ئیرهابی تیایە وتی: بوونی تۆ مەترسیە لەسەرمان و پێویستە ئێرە جێبێڵیت، کاتێك ئەو موجاهیدە کۆچەرانە ئەو خاکە ئیسلامییانەیان جێهێشت، حکومەتی سودانی وتیان: تەنها لیبییەکان دەمێننەوە، کۆچەری لیبی دەمێنێتەوە کێشەیەك نیە، ئینجا تەنها چواریان مانەوە لە سودان، لەو ماوەیەشدا پەیوەندییەکە خراپ بوو لە نێوان سودان و لیبیا، وە دانوستانەکانیش بەڕێوە دەچوو لە نێوانیان بۆ چاککردنی پەیوەندییەکە، وەزیری سودانی ئەو چوار موجاهیدەی لەگەڵ خۆی برد بۆ لای قەزافی و ڕادەستی قەزافی کردن جا ئەویش لە ڕۆژی جەژندا هەموویانی کوشت! والله لەوانە خراپتر نیە لەسەر

(١)الشورى: ٣٨.

ئیسلام، هیچ دینێك و هیچ حیزبێك و هیچ شتێك نادۆزیتەوە خراپتر و بە زیانتر بێت لەسەر ئیسلام لە ئیخوانی میصر؛ چونکە هەمیشە دەبینرێن لە پاڵ نەسارا و لە پاڵ کافران و لە پاڵ ڕافیضە، بەڵام نابینرێن ڕۆژێك لە ڕۆژان لە پاڵ موسڵمانان بن بەڵکو لە سەرسەختترین دوژمنەکانی موسڵمانانن لە هەر کوێیەك هەبن، جا نموونەی وەك ئەوانە "سەلیم جبوری" دێت و لەسەر سەری دەنوسێت (وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ) وە دەدوێت بە ئایەتەکان و فەرموودەکان و خۆی دەداتە پاڵ حیزبێك ناوی لەخۆی ناوە ئیسلامی، پاشان ڕاوێژ دەکات بە ئێزیدێك، وە ڕاوێژ دەکات بە شیوعیێك، وە ڕاوێژ دەکات بە عەلمانییێك، وە ڕاوێژ دەکات بە ڕافیضییێك، وا گومانیش دەبات شتێکی بەجێهێناوە لە دینی الله یان دیموکراسی بریتییە لە ئیسلام و ئیسلامییش بریتییە لە دیموکراسی!! جا ئیسلام لە کوێی دیموکراسیدایە لە هەڵبژاردنی دەسەڵاتداران؟! وە ئیسلام لە کوێی دیموکراسیدایە لە پەرلەمانەکان.

وە دێمە سەر زیاتر لە وردەکارییەکانی جیاوازی لە نێوان ئیسلام و دیموکراسی لە ئەنجومەنی تەشریع لە پەرلەمان:

یەکەم: شورا، کاتێك دەڵێین ئەمە لە ئیسلامدایە پێویستە لەسەرمان بنچینەکەی بچەسپێنین، واتە بەڵگە بهێنین لەسەر ئەوەی شورا لە ئیسلامدایە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی شورا لە ئیسلامە ئەم فەرموودەیەی الله تعالی ـیە بۆ رسول الله (ﷺ): ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ﴾[1] ، واتە: کەوابوو (ئەی پێغەمبەر (ﷺ)) بەهۆی ڕەحمەتی خواوەیە تۆ نەرم و هێمن بویت لەگەڵیاندا، خۆ ئەگەر توڕە و قسە ڕەق و بێ بەزەیی بوویتایە، ئەوە هەموو لە دەورت بڵاوەیان دەکرد، کەواتە چاوپۆشیان لێبکە و لێیان ببورە و داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکە، لە کار و پێشهاتدا پرس و ڕایان پێبکە، ئەگەر بڕیارتدا (کارێك ئەنجام بدەیت، ئەنجامی بدە و) پشت بە الله ببەستە. الله تعالی فەرمان دەکات بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ)ڕاوێژ بکات بە هاوەڵانی، ئەمەش چەسپاندنی بەڵگەیە لەسەر شەرعیەتی شورا لە ئیسلامدا، ئیمامی شافیعی -رحمە الله تعالی- لە تەفسیرەکەیدا "أحکام القران" دەڵێت: "پێغەمبەر پێویستی بە ڕاوێژکردن نیە، بەڵام دەیەوێت دەسەڵاتداران کار بەمە بکەن لە دوای ئەو (واتە الله عز وجل ویستی دەسەڵاتداران کار بکەن و دەستبگرن بە شورا وەك سوننەتێك بۆیان) بۆیە هەر دەسەڵاتدارێك بێت ئەوا پێویستە لەسەری ڕاوێژ بکات لەو بابەت و کارانەی شیاوە بۆ ڕاوێژکردن"، تەنانەت هەیانە وەك (ابن عطیة -رحمە الله تعالی-) ڕاوێژکردن بە واجب دەزانێت لەسەر دەسەڵاتدار، بەتایبەتی ڕاوێژکردن بە زانایان، کەوایە ئەمە

(١)آل عمران: ١٥٩.

بەڵگەیەك بوو لەسەر ئەوەی شورا لە ئیسلامە، باشە، کوا بەڵگە لەسەر ئەوەی دیموکراسی لە ئیسلامە تەنانەت ئەگەر فەرموودەیەکی هەڵبەستراویش بێت؟! نیە، جا ئەمە ئیسلامە؟ ئەمە ئیسلام نیە.

ئەمە لە ڕووی چەسپاندنی بەڵگە و بنچینەوە، لەبارەی لایەنی پێناسەوە، جیاوازی لە نێوان شورا لە ئیسلام و دیموکراسی لە پێناسەدا سەرنج بدە، پێشتر لەبیرتانە کاتێك پێناسەی دیموکراسییمان کرد بەپێی ئەوەی لە لای ئەوان هەیە وتمان: سەروەری بۆ گەل، وە مانای سەروەرییش ئەو دەسەڵاتە بوو کە هیچ دەسەڵاتێکی تر لەسەرووی ئەوەوە نیە ئەمە پێناسەی دیموکراسی بوو، باشە، پێناسەی شورا چییە، (ابن العربي -رحمه الله-) لە تەفسیرەکەیدا لە پێناسەی شورا دەڵێت: "پیشاندان و خستنەڕووی بابەت و باسەکەیە بۆ باشترینیان تاوەکو مەبەست لێی بزانرێت"، خستنەڕووی باسەکەیە بۆ باشترینیان واتە بۆ باشترین کەسەکان، لە ماوەی ئەوەی خوێندوومەتەوە و لە ماوەی وەستانم لەسەر هەندێك لە پێناسەکان، لەبارەی پێناسەی شورا بەم شێوەیە وتم، شورا: وەرگرتنی بۆچوونەکانی موسڵمانانە بۆ زانینی ڕاست و دروستەکە لە بۆچووندا هەر یەك بەگوێرەی پسپۆڕی و شارەزایی خۆی"، مانای ئەم پێناسەیە چییە؟

سەرەتا: ڕاوێژ تەنها بە موسڵمانان دەکرێت، تەنها موسڵمانان ڕاوێژیان پێدەکرێت، ئامانجیش لە ڕاوێژکردن، ئەوەی ڕاوێژ دەکات دەیەوێت ڕاستترین بۆچوون بزانێت لەم بابەتەدا، بۆچوونێك هەیە و بۆچوونێکی تر هەیە و بۆچوونێکی تر هەیە، ڕاوێژ دەکات بە فڵان و ڕاوێژ دەکات بە فڵان بۆ ئەوەی بۆی ڕوون ببێتەوە ڕاست و دروستترین بۆچوون چییە لە ڕووی شەرعییەوە لەم بابەتەدا، مەرجێکی تر بۆ گەیشتن بە ڕاست و دروستەکە باسمان کرد و وتمان "هەر یەکێك بە گوێرەی شارەزایی خۆی" ئەمە واتە بابەتەکە ئەگەر شەرعی بێت ئەوا ڕاوێژ دەکرێت بە زانایان، ئەگەر سەربازیی بێت خاوەن پسپۆڕی و شارەزا لەم بوارە ڕاوێژیان پێدەکرێت، ئەگەر بەڕێوەبردن بێت ئەگەر خزمەتگوزاری بێت ئەگەر هونەری بێت ئەگەر تەکنیکی بێت، بۆیە دەسەڵاتدار و کاربەدەست لەوانە هەڵدەبژێرێت بۆ هەر زانستێك لەو زانستانە و ڕاوێژیان پێدەکات بەگوێرەی پسپۆڕییەکەیان؛ چونکە من ئەگەر بدوێم لە لایەنی شەرعی ئەگەر پرسیارم لێبکات لەبارەی تەکنیکییەکان و ڕاوێژم پێبکات من هیچ سوودێکم بۆی نابێت لەم بابەتەدا، هەروەها شارەزای تەکنیکی ئەگەر ڕاوێژی پێبکرێت لە بابەتە شەرعییەکان لەوانەیە هیچ سوودێك نەبەخشێت، بۆیە بۆچوونەکانی موسڵمانان وەردەگیرێت بۆ گەیشتن بە ڕاستترین بۆچوون هەر یەك بەگوێرەی پسپۆڕییەکەی.

ئەمە شورایە لای ئێمە لە ئیسلام، بەڵام پێناسەکەی لە دیموکراسی بۆم باس کردی، باشە، پەیوەندی لە نێوان شورا و دیموکراسی لە پێناسەدا لە کوێیە؟ کەوایە پەیوەندی نیە لە نێوانیان نە لە چەسپاندنی بەڵگە و نە لە پێناسەدا.

جیاوازیێکی تر لە نێوان شورا و دیموکراسی ئەوەیە کە شورا الله تعالى کردوویەتی بە سیفەتێکی ئیمانداران لەنێو نۆ سیفەت، الله عز وجل لە ئایەتەکانی سورەتی (الشورى) باسی نۆ سیفەتی ئیماندارانی کردووە لەنێو ئەو سیفەتانەش (**وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ**) سەرنجی ئایەتە پیرۆزەکە بدە ﴿**فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيۡءٖ فَمَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ٣٦ وَٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُواْ هُمۡ يَغۡفِرُونَ ٣٧ وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٣٨ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡبَغۡيُ هُمۡ يَنتَصِرُونَ ٣٩**﴾[(١)] ، واتە: جا هەر شتێکتان پێبەخشراوە، ئەوە زینەتی ژیانی ئەم دونیایەیە، بەڵام ئەو بەشەی کە لەلای الله ـیە چاکتر و بەردەوامترە بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و هەر پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن * ئەوانەی خۆیان لە گوناهی گەورە و تاوانی خراپ و ناشرین دەپارێزن، کاتێك تووڕە دەبن (لەسەر هەڵەیەك کە بەرامبەریان دەکرێت) هەر ئەمان چاوپۆشی دەکەن و لێدەبورن * ئەوانەش بەدەم بانگەوازی پەروەردگاریانەوە چوون و نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام داوە و کاروباریان هەردەم بە ڕاپرسی و ڕاوێژکاریە لەنێو خۆیاندا و لەو ڕزق و ڕۆزیەی کە پێمان داون، دەبەخشن * هەروەها ئەوانەی کە دەستدرێژیان کرایە سەر، دەسەوسان ناوەستن و بەرگری لە خۆیان دەکەن.

ئەمە نۆ سیفەتی ئیماندارانە کە الله عز وجل باسی کردووە لەم ئایەتانە، لەنێو ئەو سیفەتانەش ئەوەیە کاروباریان بە ڕاپرسی و ڕاوێژکردنە لەنێوان خۆیاندا.

سیفەتی یەکەم: ئیماندارن، کەوایە هەر کەسێك لە غەیری ئیمانداران بێت هیچ پەیوەندیێکی بە ئایەتەکە نیە، نە لەم سیفەتانە و نە لە سیفەتی شورا، چونکە الله عز وجل لە سیفەتەکانی ئیمانداران دایناوە کە ئەوان ڕاوێژ دەکەن لە نێوان خۆیاندا، بۆیە مەرجی یەکەم تاوەکو ئینسان لەوانە بێت ڕاوێژ دەکەن و لەوانە بێت ڕاوێژیان پێدەکرێت ئەوەیە کە ئیماندار بێت.

مەرجی دووەم: وە پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن، وە مانای پشتبەستنیش ئەوەیە کە دەست بگرێت بە هۆکارەکان و پشت ببەستێت بە پەروەردگاری هۆکارەکان نەك پشت ببەستێت بە هۆکارەکان -ئەمە پوختەکەیەتی-، لە ئیمامی ئەحمەد ـەوە -رحمه الله- گێڕدراوەتەوە پیاوێك هاتە لای و وتی: دەمەوێت حەج بکەم بە پشتبەستن -التوكل- (واتە دەربچم بۆ ماڵی الله کە لە یەمەن بوو بەبێ ئەوەی هیچ

(١)الشورى: ٣٦ - ٣٩.

خۆراكێك يان ئاو يان پێداويستييێك لەگەڵ خۆم ببەم) ئینجا ئیمامی ئەحمەد پێی وت: بە تەنها حەج دەكەيت يان لەگەڵ كۆمەڵێك؟ وتی: لەگەڵ كۆمەڵێك، وتی: تۆ پشتتبەستووە بە توێشووی هاوڕێكەت"، چونكە لە ڕێگادا برسيت دەبێت ئینجا داوای خواردنيان لێدەكەی، وە تێنوو دەبيت ئینجا داوای ئاويان لێدەكەی، بۆيە تۆ پشتت نەبەستووە بە الله، بەڵكو پشتتبەستووە بەوانەی لەگەڵتن لەو كەسانەی بەنيازی حەجن، كەوايە پشتبەستن بريتييە لەوەی دەست بگريت بە هۆكارەكان بەڵام پشت نەبەستيت بە هۆكارەكان بەڵكو پشتببەستيت بە خوای هۆكارەكان.

ئەمەش سيفەتێكی ئیماندارانە (وَٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ) ئەمە سيفەتی ئەوانەيە كە ڕاوێژ دەكەن لەنێو خۆياندا، باشە، وەك ئاشكرايە كبائر الإثم: گوناه و تاوانە گەورەكانە، الفواحش: لە وانەيەكی پێشوو باسمان كرد وتمان زينا و كاری گەلی لوط و گوناهـ و سەرپێچييەكان و ڕەزيلی و شيرك دەگرێتەوە، (وَإِذَا مَا غَضِبُواْ هُمۡ يَغۡفِرُونَ) ئەو جۆرە كەسانە لە سيفەتەكانيان ئەوەيە لە كاتی توڕەبووندا خۆشدەبن لەو كەسەی توڕەيان دەكات، هاوكات جياوازی هەيە لە نێوان توڕەبوون و ستەمدا، لەوانەيە توڕە ببيت بەهۆی هەندێك شتەوە، بەهۆی هەر شتێكەوە بێت، بەڵام ئەگەر ستەمێكت هاتە سەر ئەمەيان شتێكی ترە.

سيفەتێكی تری ئەوانە: (وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ) واتە لەوەی فەرمانيان پێدەكات و لەوەشی نەهی و ڕێگريان لێدەكات (وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ) واتە بە پارێزگاريكردن لە كاتەكانی، ياخود بە ئەنجامدانی بە مەرجەكانی خۆی هەروەك ئیمامی ماوەردی -رحمه الله تعالی- دەيڵێت لە تەفسيرەكەی، (وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ) لە سيفەتەكانی ئیماندارانە كە ئەوان لە نێوان خۆياندا ڕاوێژ دەكەن، باشە، مانای (بَيۡنَهُمۡ) چييە؟ بَيۡنَهُمۡ: واتە لە نێوان ئیمانداران و موسڵمانان، جا چۆن ڕاوێژ دەكرێت بە ڕافيضی و نەسڕانی و شيوعی و ئێزيدی پاشان بنوسرێت (وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ) ئەوانە لە كوێی (ب بَيۡنَهُمۡ)ـن؟ (وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ) واتە ئیمانداران لە نێوان خۆياندا ڕاوێژ دەكەن، بەڵگەی ئەمەش بە هەمان شێوە فەرمانی الله عز وجل بۆ پێغەمبەرەكەی ﷺ (وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ) [1] ، لە مەدينە هەندێك لە موشريكەكان هەبوون، وە لە مەدينە جوولەكەش هەبوون، وە پێغەمبەر ﷺلەگەڵ هاوەڵانی لە مەدينە بوون، جا كاتێك الله عز وجل فەرمانی پێكرد ڕاوێژ بكات، وا تێنەگەيشت لەم فەرمانە كە بچێت بۆ لای جوولەكە -حاشا لەو- و بڵێت: چی دەڵێن لەبارەی ئەم بابەتە!؛ چونكە ئەوانە لەو كەسانە نەبوون كە باوەڕيان هێناوە بە رسول الله، (وَشَاوِرۡهُمۡ) واتە ڕاوێژ بكە بە هاوەڵەكانت لە كار و پێشهاتدا، وە ئەوانەش لە هاوەڵانی ئەو نەبوون،

(١)آل عمران: ١٥٩.

هەروەها ڕاوێژی نەكرد بەو موشریكانەی لە مەدینە بوون؛ چونكە لەو كەسانە نەبوون كە باوەڕیان هێناوە بەو، (وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ) : واتە هاوەڵانت، كەوایە ڕاوێژكردن لە سیفەتەكانی ئیماندارانە، وە ڕاوێژ دەكەن لە نێوان خۆیاندا و ڕاوێژ ناكەن بە هیچ كەسێك لە دەرەوەی دینی ئیسلام.
(وَالَّذِينَ إِذَا أَصَابَهُمُ الْبَغْيُ هُمْ يَنْتَصِرُونَ ) زانایان دەڵێن: جیاوازی لە نێوان ئایەتی یەكەم (وَإِذَا مَا غَضِبُوا هُمْ يَغْفِرُونَ ) (وَالَّذِينَ إِذَا أَصَابَهُمُ الْبَغْيُ هُمْ يَنْتَصِرُونَ ) وە ئەو ئایەتە پیرۆزەی لە دوای ئەو دێت ﴿وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ﴾[1]، واتە: جا تۆڵەی هەر تاوانێك بە ئەندازەی تاوانەكەیە بێ زیاد و كەم، ئەو كەسەی لێخۆشبوونی هەبێت و چاوپۆشی و چاكسازی بكات، ئەوە پاداشتی لای الله ـیە. ئازادی پێبەخشیت لەوەی بەرگری لە خۆت بكەیت و تۆڵە بكەیتەوە و ئازادی ئەوەی پێبەخشیت كە لێخۆشبیت و چاوپۆشی بكەیت، هەرچەندە ئایەتەكانی تریش هان دەدەن لەسەر لێخۆشبوون و هان دەدەن لەسەر ئاشتەوایی كردن، بەڵام لێرەدا فەرمووی ئەگەر ستەمێكت لێكرا ئەوا مافی خۆتە بەرگری لە خۆت بكەیت و تۆڵە بسێنیتەوە، بەڵام ئەگەر ویستت چاوپۆشی بكەیت و لێخۆشبیت بە هەمان شێوە كارەكە لە دەست خۆتە و پاداشتیشت لە لای الله ـیە -تبارك وتعالی- .
كەوایە شورا سیفەتێكی ئیماندارانە و ڕاوێژ دەكەن لەنێوان خۆیاندا، باشە، ئەمەی وتم لە كوێی ئەنجومەنی تەشریعی عێراقی هەیە؟ چەند كۆمەڵە و لایەن لەم ئەنجومەنەن؟ "سەلیم جبوری" ڕاوێژ بە چەند كەس دەكات لەوانە؟ جا چۆن بڵێین ئیسلام دینێكی دیموكراسییە؟ شورا لە كوێیە لە نێوان ئیسلام و ئەوانەدا؟ هەر بۆیە دەیبینی دەڵێت: بابەتەكە دەخەینەڕوو بۆ دەنگدان، وە دەستیان بەرز دەكەنەوە و بابەتەكەش كۆتایی پێدێت، بە كۆدەنگی بڕیاردرا و بوو بە تەشریع -پەنا بە الله- وە ئەگەر بپرسیت [واتە بپرسیت لەبارەی ئەم دەنگدانە كە جگە لە موسڵمانانیشی لەخۆگرتووە دەبینی دەڵێت: ] (وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ) ڕاوێژمان كرد بەوانەی لەگەڵمانن!
كەوایە هیچ پەیوەندییێك نیە لە نێوان ئیسلام و دیموكراسی لە بابەتی ئەوەی كە شورا سیفەتێكی ئیماندارانە و ڕاوێژ دەكەن لە نێوان خۆیاندا، جیاوازییەكانی تر لە نێوان شورا و دیموكراسی:
وتمان لە ئیسلامدا كافران ڕاوێژیان پێناكرێت، هەرچەندە خاوەن پەیمانەكان سەرانە دەدەن بە موسڵمانان، ئێستا لە خاكی ئیسلام لەم دەوڵەتەمان -ولله الحمد والمنة- نەساڕا هەن و سەرانە دەدەن، ئایا دەكرێت ڕاوێژیان پێبكەین لە هەندێك بابەت؟ نەخێر ناكرێت، ناكرێت ڕاوێژیان پێبكرێت لە هیچ بابەتێك لەو بابەتانەی تایبەتە بە موسڵمانان و تایبەتە بە خاكی ئیسلام، بەڵكو ئەوان ملكەچن بۆ حوكمەكانی الله

(١)الشوری: ٤٠.

تعالى، هيچ بۆچوونێك بۆ ئەوان نیە لەوەی ئێمە دەیبینین بۆ خۆمان لە حوکم یان بۆچوون یان ڕاوێژکردن، لە کاتێکدا لە پەرلەمان نەساڕا ڕاوێژیان پێدەکرێت، وە الله تعالى تەکفیری نەساڕای کردووە کاتێك فەرمووی ﴿لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖۘ﴾[1] ، جا بەدڵنیاییەوە لە پەرلەماندا کافر ڕاوێژی پێدەکرێت بەڵام لە ئیسلامدا ڕاوێژ ناکرێت تەنها بە موسڵمان نەبێت (وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ).

جیاوازییێکی تر لە نێوان شورا و دیموکراسی: لە ئیسلامدا لە خاکی ئیسلام شتێك نیە بەناوی عەلمانی یان نەتەوەیی یان شیوعی، جا ئەگەر هیچ بوونێکیان نەبێت لە خاکی ئیسلام کەوایە بەدڵنیاییەوە ڕاوێژیان پێناکرێت، چۆن ڕاوێژ بکەم بە کەسێك کە قبوڵ ناکەم بوونی هەبێت لەنێوماندا، ڕازی نابین بەوەی لە خاکی ئیسلام کەسێك هەبێت بیروباوەڕی شیوعیەتی هەڵگرتبێت ئەگەر هەشبێت ئەوا داوای تەوبەی لێدەکرێت ئەگەریش تەوبە نەکات ئەوا دەکوژرێت، بە هەمان شێوە نەتەوەیی و عەلمانی، هەموو ئەوانە قبوڵ ناکرێن لە خاکی ئیسلام جا کە بوونیان نەبێت کەوایە بەپێویستییەوە ناکرێت ڕاوێژ بکەین بە کەسانێك کە قبوڵ ناکەین هەبن لەناوماندا.

وە عەلمانیەت هەروەك دەزانن -پێناسەمان کرد لە وانەیەکی پێشوو- هەروەك لە ئۆکسفۆرد هاتووە کاتێك دەڵێن: "چەمکێکە وای دەبینێت کە خوێندن و ئەخلاق لەسەر بناغەیەکی نادینی دادەمەزرێت" پێناسەیەکی ترم بۆ عەلمانیەت بینی لە پەڕتوکەکە، خاوەنی ئەم پەڕتوکە چی دەڵێت؟ دەڵێت: "عەلمانیەت واتە ئینسان پەیوەست نەبێت لە ڕێکخستنی بیرکردنەوەکانی و کردەوەکانی بەگوێرەی پێوەرە سەپێنراوەکان لەسەری -سەرنج بدە- بەوەی کە شەریعەتێکە یان ویستێکی خواییە" ئەوانە قبوڵ دەکرێن لەناو موسڵمانان؟ بەدڵنیاییەوە نەخێر، جا چۆن ڕاوێژیان پێدەکرێت لە کاتێکدا دەبینی کەسی عەلمانی لە پەرلەمان سەلیم جبوری و لەژێر فەرموودەی الله عز وجل (وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ) ڕاوێژ دەکات بەمانە.

[یەکێك لە قوتابیەکان داوای لێدەکات پێناسەکە دووبارە بکاتەوە، جا دەڵێت: ] "عەلمانیەت واتە ئینسان پەیوەست نەبێت لە ڕێکخستنی بیرکردنەوەکانی و کردەوەکانی بەگوێرەی پێوەرە سەپێنراوەکان لەسەری بەوەی کە شەریعەتێکە یان ویستێکی خواییە" واتە شتێك لە شەریعەت، تۆ دەڵێی ئەمە لە شەریعەتە و تۆش پابەند دەبیت بەم شەریعەتە، ئەو دەڵێت: من عەلمانییم شەریعەت قبوڵ ناکەم!،ئەمە فەرمانی الله ـیە -عز وجل-، کەچی دەڵێت: من عەلمانییم پابەند نابم بە فەرمانە خواییەکان و بە فەرمانە شەرعییەکان.

پێناسەی ڕاست و دروست بۆ عەلمانیەت ئەوەیە بە واتای: نادینی دێت، ئەمە بریتییە لە پێناسەی دروست بۆ ئەم وشەیە، کە وشەیەکی بەریتانییە (secularism) ئاوای پێدەڵێن، بۆیە پێناسەی ڕەسەن لە

(١)المائدة: ٧٣.

لای ئەوان بۆ عەلمانیەت "نادینییە" بەڵام ئەوان پێی دەڵێن عەلمانیەت هەروەك پێشتر وتمان؛ چونكە كاتێك دەڵێت عەلمانی زۆر سادە و سوكترە لەوەی بڵێت "نادینی".

كەوایە ئەمەش جیاوازییێك بوو لە نێوان شورا لە ئیسلام لەگەڵ دیموكراسی، ڕاوێژ ناكەین بە كافران هەرچەندە خاوەن پەیمانیش بن، نە عەلمانییەكان و نە شیوعییەكان قبوڵ دەكەین جا چۆن ڕاوێژیان پێدەكەین! هەموو ئەوانەش ڕاوێژیان پێدەكرێت لە دیموكراسی، وە ئەنجومەنە تەشریعییەكان خراپترین شایەدە لەسەر ئەوەی وتم.

هەروەها ڕاوێژ ناكەین بە ڕافیضە لە ئیسلامدا، ڕافیضە ڕاوێژیان پێناكرێت؛ چونكە ئەوانە هەڵگەڕاوەن لە دینی الله عز وجل، وە هەروەك چۆن ئێمە تەكفیریان دەكەین بە هەمان شێوە ئەوانیش تەكفیرمان دەكەن، جا ناكرێت قبوڵ بكەین كە لە ئیسلامدا ڕاوێژكارێكی ڕافیضییمان هەبێت؛ چونكە ئەوانە ڕۆژێك لە ڕۆژان هەر شتێكیان لە كاروباری موسڵمانان گرتبێتە دەست ئەوا بوونەتە خراپە و تەنگ و چەڵەمە لەسەر ئیسلام و موسڵمانان، هەروەك وەزیر "الطوسي" كاتێك لەگەڵ خەلیفەی عەباسی بوو ئەو بوو كە تەتاری هێنایە نێو وڵاتانی موسڵمانان، وە ڕافیضە ئەگەر الله عز وجل ئاسانی بكات ئەوا بەدرێژی لەبارەیان قسە دەكەین، بەڵام ئەوان دینێكیان هەیە و ئێمەش دینێكی تر، چونكە ئەوان دینەكەیان وەردەگرن لە پەڕتوكە تایبەتەكانیان كە ئێمە لە بنەڕەتدا دانیان پێدانانێین، "الكافي" لە دانراوی (محمد بن یعقوب الكلیمي)، ئەم پەڕتوكە ئەگەر بیخوێنیتەوە نەخۆش دەكەویت، من بەزۆركردن لە خۆم توانیم بیخوێنمەوە و لە جاری سێیەم توانیم تەواوی بكەم؛ چونكە نە عەقڵت و نە دینەكەت بەرگە ناگرێت كاتێك ئەم قسانە دەبینی لە پەڕتوكی كەسانێك بانگەشەی ئەوە دەكەن ئەوان شوێنكەوتەی ئەهلی بەیتن، ژمارەی ڕیوایەتەكان لەم پەڕتوكەدا شازدە هەزار و شتێك ڕیوایەتە، بە لێكۆڵینەوەی خۆیان: یازدە هەزار ڕیوایەت لاوازە ئەمە بە لێكۆڵینەوەی خۆیان! بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا كار دەكەن بە ڕیوایەتە لاوازەكان؛ چونكە ئەگەر ڕیوایەتی لاواز وازلێبێنن ئیتر هیچ دینێك لای ئەوان نامێنێت، جا كەسێك ئەمە دینەكەی بێت چۆن ڕاوێژیان پێدەكەین، كەسانێك هاوەڵانی رسول الله ﷺ تەكفیر دەكەن چۆن ڕاوێژیان پێدەكەین؟ كەسانێك تەكفیری موسڵمانان دەكەن، والله برایان ئێمە دەڵێین ئەوان موڕتەدن، بەڵام بیریشت نەچێت كە ئەوان حوكمیان لەسەر ئەهلی سوننە داوە بەوەی كافرن و كوشتنیان دروستە لە لای ئەوان تەنانەت هەموو -پەرزین بێت لە ڕووتان- هەموو ئەهلی سوننە نەوەی زینان لە لای ئەوان! دەزانی بۆچی؟ دەڵێت: چونكە لە سامانی ئێوە پێنجیەكی مافی ئیمامە، وە ئێوە مافی ئیمام نادەن، وە هاوسەرگیری دەكەن بەم پارە و سامانە بۆیە گرێبەستەكە دروست نیە، كەوایە هاوسەرگیرییەكە زینایە جا ئەوەشی لەم گرێبەستە پەیدا دەبێت ئەوا منداڵی زینایە، هەموو ئەهلی سوننە منداڵی زینان لە لای ئەوان! بەڵام

ناتوانن به ئاشكرا ئەمه بڵێن، هەموو ئەهلی سوننه كافرن له لای ئەوان، بۆچی؟ چونكه ڕافیضه هاوەڵانی پێغەمبەریان (ﷺ)تەكفیر كردووه، وه هۆكاری تەكفیركردنەكەش دەڵێن: چونكه عەلی له ویلایەت دانراوه له لایەن الله ـوه -عز وجل، واته الله عز وجل كردوویەتی به پێشەوا دوای رسول الله جا ئەوەی دان نەنێت به پێشەوایەتیەكەی ئەوا كوفری كردووه به الله، بۆیه صەحابەیان تەكفیر كردووه چونكه نەیانوتوه عەلی ببێته پێشەوا دوای پێغەمبەر (ﷺ)و ئەبو بەكریان پێشخستووه، ئێمەش به هەمان شێوه ئەم قسەیه دەكەین، جا ئەوەی ناوەستێت له تەكفیری صەحابه، دەوەستێت لەبارەی من و تۆ ؟!

بۆیه ئێمه له تێڕوانینی ئەوان كافرین، هەندێك له دەقەكانت بۆ دەخوێنمەوه تاوەكو بزانیت بۆچوونیان چۆنه بەرامبەر ئەهلی سوننه، ئێمه هەموومان (النواصب)ـین، وا گومان مەبه كه ئەو پێناسەیەی توانیان بڵاوی بكەنەوه لەنێو ئەهلی سوننه وتیان: (الناصبي) بریتییه لەو كەسەی دوژمنایەتی ڕاگەیاندووه بەرامبەر ئەهلی بەیت، وه خەڵكیش كاتێك دەڵێن: من الحمد لله، من دوژمنایەتی ئەهلی بەیت ناكەم من (ناصبي) نیم، نەخێر، ئەمه پێناسەیەكه توانیویانه بیخەنه نێو موسڵمانان، ئەگەرنا له دینەكەیاندا هەر كەسێك درابێته پاڵ ئەهلی سوننه ئەوا (ناصبي)ـیه، سەرنج بده چی هەیه له "الأنوار النعمانية" هی پیاوێكه بەناوی "نعمة الله الجزائري" -سەرنج بده- دەڵێت: "بەڵكو هەواڵەكانیان ئەوه دەردەخەن (واته هەواڵەكانی پێشەوایان حاشا لەوان) بەڵكو هەواڵەكانیان ئەوه دەردەخەن كه -النّاصب- بریتییه لەو كەسەی لای ئەوان پێی دەوترێت سوننی"، هەموو سوننیەك جا هەواڵەكان جەخت دەكەنەوه كه ئەوانه (نواصب)ـن، وه له هەمان پەڕتوكدا له جێگەیەكی تر دەڵێت: "وه هیچ قسەیەك نیه لەوەی مەبەست له (الناصبة) بریتیین له شوێنكەوتەی سوننه" بەبێ جیاكردنەوه، وه له جێگەی سێیەم دەڵێت -هەمان كەس- "وه ئەم مانایەش (واته ئەوەی كه هەموو كەسێكی سوننی ناصبییه) وه ئەم مانایەش جەخت لەوه دەكاتەوه كه پێشەوایان (عليهم السلام)و تایبەتەكانیشیان وشەی (النّاصبي)ـیان بەكارهێناوه بۆ ئەبی حەنیفه (مەبەست له نوعمان ـه -رحمه الله تعالى-) وشەی ناصبییان بەكارهێناوه بۆ ئەبی حەنیفه و هاوشێوەكانی هەرچەنده ئەو لەو كەسانه نەبووه كه دوژمنایەتی بەرپاكردبێت بۆ ئەهلی بەیت".

كەوایه وا گومان نەبەی كه (النّاصبي) بریتییه لەو كەسەی دوژمنایەتی ڕاگەیاندووه، نەخێر، ئەبو حەنیفه -رحمه الله- كه دوژمنایەتی هیچ كەسێكی نەكردووه له سەردەمی خۆی، لەگەڵ ئەوەشدا پێشەواكانیان پێی دەڵێن ناصبی، تەنانەت له پەڕتوكی "الكافي" له دوو جێگەدا یاخود سێیانه، قسەیەكی تیایه دراوەته پاڵ هەندێك له پێشەواكانیان: "نەفرەتی الله لەسەر ئەبو حەنیفه و نەفرەتی الله لەسەر ئەبو حەنیفه"! .

جا كه ئێمه (نواصب)ـین، خومەینی حوكمی لەسەر ئێمه داوه بەوەی پیسین -ئەم پیسه پەرژین بێت له ڕووتان- سەرنج بده وتەكەی له "تحليل الوسيلة" ئەم خومەینیه چەپەڵه دەڵێت: "سەبارەت به

(النواصب) و خەواریج نەفرەتی الله تعالی لەسەریان بێت ئەوا هەردووکیان پیسن بەبێ وەستان" وەك زانراوە خەواریج ئەوانە بوون کە حوکمیان سەندەوە لە پێشەوایان و دەستیان بەسەرداگرت، ئەوانە خەواریج بوون، هەروەها ناصبی، مادام ئەهلی سوننە نواصب بن کەوایە هەموومان لە لای خومەینی چەپەڵ پیسین تەنانەت کافریشین، هەتاوەکو ناصبی و پیس بێت مانای وایە کافرە، محمد باقر المجلسي کە ناسراویشە بە "الملا محمد باقر المجلسي" پەڕتوکێکی هەیە بەناوی "مرآة العقول" و پەڕتوکی "بحار الأنوار"ـیشی هەیە، بحار الأنوار سەد و دە بەرگە، پاشاوەیەکی تیادا کۆکردۆتەوە کە هەر الله عز وجل پێی زانایە، سەرنج بدە ئەم "المجلسي"ـیە چی دەڵێت، هاوکات ئەمە تەقییە ناکات بۆچی؟ چونکە لە سەردەمی سەفەوییەکان دەرکەوت جا لە هیچ کەسێك نەدەترسا بۆیە بە ڕاشکاوی دەیوت، وەك حاڵی ئێستایان لە کەناڵە ئاسمانییەکان و دەڵێن نەفرەت لە عومەر و نەفرەت لە فڵان و نەفرەت لە فڵان، بۆچی؟ چونکە کاتەکە کاتی تەقییە نیە، ئەوان لە دەسەڵاتن، جا ئەم "المجلسي"ـیە لە سەردەمێك بووە پێویستی بە تەقییە نەبووە، سەیربکە چی دەڵێت، دەڵێت: "بزانە کە بەکارهێنانی وشەی شیرك و کوفر بۆ ئەو کەسەی باوەڕی نیە بە پێشەوایەتی پێشەوای ئیمانداران و پێشەوایان لە کوڕەکانی (عليهم السلام)وە غەیری ئەوان فەزڵ دەدات بەسەریان، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەوان کافرن و بە نەمری دەمێننەوە لە ئاگر" هەر کەسێك دان نەنێت بە پێشەوایەتی عەلی و پێشەوایانی دوای ئەو و دان بنێت بە پێشەوایەتی جگە لەوان ئەوا دەڵێت: بەڵگەی زۆر هەیە لەسەر ئەوەی ئەوان کافرن و بە نەمری دەمێننەوە لە ئاگر، ئێمە هەموومان دەڵێین پێشەوایەتییەکەی لە الله ـوە نیە، وە هەموومان دەڵێین کە خەلیفە لە دوای ئەو [پێغەمبەر (ﷺ)] ئەبو بەکرە، جا هەموو ئەو بەڵگانە دەیسەلمێنن لە لای ڕافیضە کە ئێمە کافرین، بەڵام ناتوانن بە ڕاشکاوانە ئەم بابەتە بخەنە ڕوو؛ چونکە دەزانن ئەوان دەرگایەك دەکەنەوە لەسەر خۆیان ئیتر دوای ئەوە ناتوانن دایبخەن، بەڵگەی ئەمەش ئێمە کاتێك وتمان لەبارەی سوپا و پۆلیسەوە ئەوان موڕتەدن سەیر بکە چیمان پێدەکەن، جا چی بگات بەوەی بێت و بڵێت ملیار موسڵمان هەموویان موڕتەدن و هەموویان کافرن، ناتوانن ئەمە دەرببڕن بەڵام ئەمە بیروباوەڕیانە و ئەمەش دینیانە.

باشە، کاتێك هەموومان کافربین ئەی حوکمەکە چییە لەبارەی سامان و خوێنمان؟ سەرنج بدە، "الصَّدوق" ئەمە شێخێکە لە لای ئەوان پێی دەڵێن "الصَّدوق ابن بابویە القِمّي" ناسراو بە "الشیخ الصدوق" پەڕتوکێکی هەیە بەناوی "التوحید" هیچ شتێکی تیا نیە لە تەوحید جگە لە ناونیشانەکەی نەبێت، وە پەڕتوکێکی هەیە بەناوی "فقیە من لا یحضرە الفقیە"، ئەمە یەکێکە لە چوار سەرچاوە سەرەکییەکانیان، ڕیوایەتێك دەگوازێتەوە دەڵێت: "لە داوود بن فرقد ـەوە وتویەتی بە ئەبی عبد الله ـم وت..." واتە (جعفر الصادق -رحمە الله-) و حاشا لەو، چی وتوە لە کوشتنی (النّاصب)؟ تۆ ئێستا زانیت

(الناصب) كێیە: ئەهلی سوننە، ئێستاش پرسیارەکە ئەوەیە چی وتوە لە کوشتنی (النّاصب)؟ دەڵێت: خوێنیان حەڵاڵە بەڵام تەقییە پێویستە لەسەرت جا ئەگەر لە تواناتدا هەبوو دیوارێك بڕوخێنی بەسەریدا یان بیخنكێنی لە ئاوێكدا بۆ ئەوەی نەتبینێت ئەوا ئەنجامی بدە -سەرنجی تەواوکەری ڕیوایەتەکە بدە- وتم: ئەی چۆن دەبینیت دەربارەی پارە و سامانەکەی؟ دەڵێت: بیبە بەپێی توانات" ئەم ڕیوایەتە هەیە لە "علل الشرائع" و هەروەها لە "وسائل الشيعة" کە هی (الحر العاملي)ـیە، بە هەمان شێوە "الجزائيرى" باسی کردووە لە "الأنوار النعمانية".

"الطوسي"، ئەمە لە "التهذيب" کە ئەمەش دووەم پەڕتوکە لە سەرچاوەکانی تەشریعیان "التهذيب" و "الاستبصار" سەرنج بدە چی دەڵێت لە "تهذيب الاحكام"، دەڵێت: "ئیمام صادق (حاشا لەو) وتویەتی لە سامانی (الناصب) ببە لە هەر شوێنێك دەستت کەوت، پێنجیەکیش بدە بە ئێمە" باشە، سەرنج بدە خومەینی چی دەڵێت لە "تحرير الوسيلة" ئەم فەتوایانە دامەزراوە لەسەر ڕیوایەتەکان لەلای ئەوان لە "الكافي" و جگە لەویش، سەرنج بدە خومەینی لە "تحرير الوسيلة" دەڵێت: "وە بۆچوونی بەهێزتر ئەوەیە ناصبی بدرێتە پاڵ جەنگکەرەکان لەبارەی حەڵاڵکردنی ئەوەی بە غەنیمەت دەگیرێت لێیان و پێنجیەکیش ببەسترێتەوە پێی، ئەوەشی ئاشکرایە دروستە سامانەکەی ببردرێت لە هەر کوێیەك بێت و بە هەر جۆرێك بێت و پێنجیەکیش بدە بە ئێمە" هەر بۆیەش ئەی گەنجەکان کاتێك سەیری هەواڵەکان دەکەن کە ئەوان هەڵیانکوتاوەتە سەر ماڵەکان و چییان بردووە و چییان بردووە، ئەوانە وا گومان مەبە کۆمەڵێك دزن، نەخێر، ئەوانە پەیڕەوی لە دینێك دەکەن، چونکە ئەگەر بکوژێت ئەوا ناصبیێك دەکوژێت بەگوێرەی ڕیوایەتەکانی لای خۆی لە پەڕتوکەکەی، وە ئەگەر پارە وپولێکی برد ئەوا سامانەکە حەڵاڵە بۆی، تەنها کاتێك دەگەڕێتەوە پێنجیەکی لێدەردەکات و دەیدات بە مەرجەع، ئەم سامانە حەڵاڵە بەو مەرجەی سامانی ئەهلی سوننە بێت، باشە، ئایا لە خاکی ئیسلام دەکرێت یەکێك لەوانە قبوڵ بکەین؟ جا ئەگەر قبوڵیان نەکەین چۆن ڕاوێژ دەکەین بە کەسانێك کە لە بنەڕەتدا قبوڵیان ناکەین، بۆیە الله عز وجل دەسەڵاتداری کردین و ئەوانمان دەرکرد لە خاکی ئیسلام و ئەم خاکەمان لە پیسییەکانیان پاك کردەوە، نە حوسەینی نە لەخۆدان، جوێندان و قسە وتن بە صەحابە، قبوڵ ناکەین، ئێستا لە دیموکراسی ئەوانە ڕاوێژیان پێدەکرێت و خاوەن بۆچوونن، جا ئەی قەرزاوی و ئەی ئیخوانی میصر شورا لە کوێی دیموکراسییە؟

هەروەها حیزبی عێراقی بە هەمان شێوە ڕاوێژیان پێناکرێت، ئەوانە هەڵگەڕاوەن لە دینی الله عز وجل، هەر کەسێك پابەندی ئەم حیزبە بێت و دەست بگرێت بە بیروباوەڕی ئەم حیزبە ئەوا هەڵگەڕاوەتەوە لە دینی الله عز وجل؛ چونکە هیچ جیاوازی نیە لە نێوان ئەو و حیزبی شیوعی، ئەوانە دەڵێن عەلمانیەت

ئەوانیش دەڵێن عەلمانیەت، ئەوانە دەڵێن دیموکراسی ئەوانیش دەڵێن دیموکراسی، دەڵێن دەستور ئەوانیش دەڵێن دەستور، هەموو ئەو وشە و زاراوانەی دەیبینی لە لای شیوعییەکان بە هەمان شێوە لە لای ئەوانیش دەیبینی، کەوایە چۆن شیوعی ئەگەر حوکم بکات بە دەستور و قانون پێی دەڵێین تاغوت، وە ئەگەر ئەوانە حوکم بکەن پێی نەڵێین تاغوت! جیاوازییەکە لە کوێیە؟ موڕسی کاتێك حوکمی کرد، جیاوازی چییە لە نێوان ئەو و سیسی و حوسنی موبارەك؟ چی گۆڕا؟ بەلایەنی کەمەوە حوسنی موبارەك کابرایەك بوو دەیوت من عەلمانییم، موسڵمانانی فریو نەدەدا بڵێت من موسڵمانم پاشان حوکم بکات بە عەلمانیەت، ئەم شتەی نەوتوە، بۆیە ئەوانەش بە هەمان شێوە ڕاوێژیان پێناکرێت؛ چونکە لەو کۆمەڵە نین کە باوەڕیان هێناوە، بەیانی تەواوی دەکەین بە ویستی الله تعالى چونکە بابەتەکە هێشتا قسەی تیادا ماوە، وجزاكم الله خير الجزاء وبارك فيكم.

**وەرگێڕانی و ئامادەکردنی**
**پێگەی ڕاستەڕێ**

